هەڵبەست بۆ منالاًن

١

# جریـــوە

چاپی دووەم

دانەر

ع.ع. شەونم

چاپخانەی راپەرین سلیمانی شەقامی کاوە ٢٠٠٩

# جریوه پێشکەش بێت

بەو جکەر گۆشانه :ـ

کە ئەمڕۆ پێویستە دەنگی زەلاڵیـان ئاوازی دەرونی پاکیان بێ و وەك باڵندە بجریوێنن .

پاشە ڕۆژیش بە پەروەردەی ڕاستیانەوە وەك ئەستێرە کون بکەنە جەرگی تاریکی و هەر بجریوێنن .

# پێشەکی

تێ گەیشتن لە زمان ئەکەوێتە پێش دوانن بە زمان ، ئەمە لە منالا زۆر تر ئاشکرایە بەڵگە ئەوەیە پێش فێربوونی وتنی « بقە تێ ئەکات کە ئەو وشەیە ئاگادار کردنێکە بۆ دوور کەوتنەوە لە ئازارێك بەڵگەیەکی تر ئەوەیە منال بە دەنگی پچڕ پچڕ کە لە سەرەتاوە خۆی دروستی ئەکات وەڵامی ئەو دواننانە ئەداتەوە کە تێی گەیوە . لە پاش ئەرکێکی گرانی پڕ لە بیر کردنەوە و لاسایی ئینجا دەنگە دروست کراوەکانی خۆی ئەگۆڕێ بۆ ئەوەی بە شێوەی وشەی ڕاست دەریان بڕیت ، بەڵام لە پێشا بە هەڵەدا ئەچێت و زۆر جار وشەی نیوەناتەواوی وەهای لەدەم دەرئەچێت کە جیاوازە لە گەل وشە ڕاستەکەدا وەك : بە تۆپ ئەڵێ « هەپو » . کە تەنها دەنگی « پ » ی ڕاستە و هەمو دەنگەکانی تر هەلەن . بەم شێوە وردە وردە دەنگەکان ئەگۆڕێ لە هەڵەوە بۆ ڕاست تا فێری وشە و بەکارهێنانی وشە ئەبێ لە نیمچە ڕستەی ناتەواوا ، هەر وەها لە ڕستەی تەواوا . ئینجا

دایک و باوک دڵیان خۆشە کە ئامانجیان پێک هات و منالەکەیان فێری زمان بو ، بەڵام وا نیە و ئامانج پێک نەهاتوە چونکە لە سەرێکەوە تەنها دوانن بەڵگە نیە بۆ فێربوونی زمان ، زۆر کەس هەن ئەدوێن بەڵام بە چەن وشەیەکی کەم ، لە کاتێکا کە زمان بە پێی وشە و ڕێزمان زۆر قووڵ و فراوانە ، وە هەمویشی پێویستە بۆ بەکارهێنان هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیا ، ئەو کەسەی کە فێریان ئەبێت ، ئینجا پێی ئەوترێت زمان زان .

لە گەڵ زمان زانینا هونەری زمان کە ویژەیە پێویستە چونکە ڕستەی تازە و نەبیسراوی کورت و پڕ لە مەبەست بە بەرهەم ئەهێنێت لە سەرێکی ترەوە زمان هۆیە نەک ئامانج هۆیە بۆ دەربڕینی مەبەست مەبەستی ئادەمزاد زۆرە منال بە زمان فێربون کوتو پڕ لەم جهانە فراوانە ناگات ، هەروەها لە دام و دەزگا و هەڵسوو کەوتی کۆمەڵی ئادەمزاد بێ ئاگایە ، پێویستە لەگەڵ ڕۆژانی تەمەنیا وردە وردە شارەزایی پەیدا بکات . بەکارهێنانی زمانیش بۆ ئەم

مەبەستە گەورەترین هۆی گرنگە ، زمـان و هونەری زمان کە وێژەیە پێویستە بەکار بهێنرێت بۆ پەروەردەی منداڵ وە بە هۆیـــەوە کورج و گوڵی و ڕاستگۆیی و دڵپاکی و شارەزایی و .... هتد لە دەروونیا ئەڕوێنرێت .

هەڵبەست هۆیەکی هونەریە یاریدەی پەروەرە ئـەدات بەکار هێنانی زمانی ڕووت بە بێ هونـــەری زمان ئامانج پێك ناهێنێ چی بۆ زمانگرتنی منداڵ چی بۆ چـــەسپانی کردەوەی چاك تیایا .

منداڵ ئەو ووشانە زوو فێر ئەبێ کە لەگەڵ ئارەزوو و هەوەسیا ئەگونجێت و پێویستی بە بەکار هێنانیەتی وەك لە سەرەتاوە بانگ کردنی دایە و بابە هاوارکردن بۆ خواردن و ناوی خواردنەکان و گەل و پەلی یاریەکانی و کاسە و کەوچکی بەر دەستی لە ماڵا و ... هتد بەڵام ناوی ڕۆژەکانی هەفتەیان ژماردن درەنـگ فێر ئەبێ چونکە پێویستی پێیان نیە یان با بڵێین تەمەنی نەگەیشتۆتە ئەو سێرەیەی کە پێویستی پێیان بێت ، چونکە پێویستی و ئارەزو و هەوەس

بە پێی ڕۆژانی تەمەن ئەگۆڕی و زیاد ئەکات لەگەڵ ئەوەشا لە توانای وێژەدا هەیە کە ئارەزوو و هەوەسی ڕۆژانی تەمەن پێش‌خات بۆ فێر بوون .

منال هەڵبەست بە یاری ئەزانێت یاری ، یەکەم خرۆشێنەری ئارەزوو و هەوەسی منالە .

ئەگەر یـاری « هەلوور بلور » ی لە گەڵا کرا زۆر بە خۆشیەوە هەوڵ ئەدات هەڵبەستی هەلوور بلور لەبەر بکات .
ئەگەر چیرۆکی کورتی وەك « داپـــیرە و ڕێوی » ی بۆ گێڕایەوە هـەر چەن لە مەبەستی چیرۆکەکە تێ ناگا بـەڵام ڕستەی « داپیر کلکە کولێم بداتـــەوە » لەگەڵ دەستی ڕاوەشانن و پێکەنینەکەدا ئەبێ بە یـاری ئەوسا حەز ئەکا زوو زوو گوێی لێ بێ بۆ ئەوەی لەبەری کات ئەمە لە ڕووی فێر بوونی زمانەوە .

خۆ لە ڕووی چەسپاندنی پەروەردەی ڕاستەوە دیسان هەر لەگەڵ زمانا بەکار هێنانی وێژە پێویستە . چەنان دایك و باوك سکاڵایانە لە دەست منالەکانیان ، چونکە

هەرچەن ئامۆژگاریان ئەکەن گوێیان نادەنێ و بە قسەیان ناکەن . ئایا بۆچی ؟ هۆکەی ئەوەیە ئامۆژگاری ڕووتی وەك : « ڕۆڵە وا هەڵسە و وا دانیشە » وشکە و نەك هەر ئارەزوو و هەوەسی منداڵ نابزوێنێ بەڵکو بێزاریشی ئەکات . بەڵام ئەگەر ئامۆژگاری بخرێتە چوار چێوەی هونەرەوە ئەوسا منداڵەکە بە خۆشیەوە وەری ئەگرێت .

بۆ نمونە ڕێکەوتوە دایك داوای جامێ ئاوی لە منداڵەکەی کردوە بۆی بهێنێت نەی هێناوە بۆ جاری دوەم بە چەشنێکی تر داوای لێ کردوە پێی وتوە « ئەوا چاو ئەنوقێنم بزانم هەتا چاو ئەکەمەوە ئەتوانیت جامێ ئاوم بۆ بهێنیت ؟ » منداڵەکە دەست بەجێ ڕای کردوە و بۆی هێناوە .

کەواتە بە هۆی خرۆشانی ئارەزوو هەوەسەوە توانای منداڵ ئاراستە ئەکرێت بۆ مەبەستی بە سوود وەك فێربوونی زمان و دامەزرانی پەروەردەی ڕاست کەواتە یەکەم خرۆشێنەری ئارەزوو و هەوەسی منداڵ یاریە . زانیمان کە زمان بە هونەرەوە منداڵ حەزی لێ ئەکات چونکە بەیاری ئەزانێ

ئێستا ئەبێ ئەوە بزانین کە گرنگ ترینی هونەری زمان هەڵبەستە .

منال هەڵبەست بە یاری ئەزانێ لەبەر ئەوە بە ئارەزوو هەوەسەوە لە یاری ئەکات و بە هەڵسوکەوت و خۆشیەوە ئەی ڵێت و ئەی ڵێتەوە . چونکە هەڵبەست زمانێکە لە چوار چێوەیەکی ڕێــك و پێکی ئاوازە دارا خولیا و هەستەکانی دەروونی خۆی پێ دەر ئەبڕێت .

بە هۆیەوە منال لە زمان ئاگادا ئەبێ و ڕستەی جوان لەبەر ئەکا وە شارەزایی یەك کە درەنگ دێت بە پیرەوە نزیك ئەخرێتەوە لێی و فێری پەیڕەوی کۆمەڵایــەتی و ئادەمزاد پەروەری ئەبێ ئاسۆی بیرو خولیای فراوان ئەبێت فراوانی یەك کە هی سێرەیەکی درەنگەو نزیك ئەبێتەوە بۆ سێرەیەکی نزیك .

ئایا هەڵبەستی منال ئەبێ چۆن بێت ؟

هەڵبەستی منال بە پێی ناوەرۆك و مەبەست ئەبێ لەگەڵ سێرەی منالەکەدا بگونجێت . وە لەو شتانە بدوێت کە بە ئاسانی هەستی پێ ئەکا یان بیری بۆی ئەچێت ، لەبەر ئــەوە ئەبێ خولیا ( خەیاڵ ) کانی نهێنی نەبێ و ئاشکرا بێ .

بەلام ئەنـدیشەکە « فکرة » ی هەلبەستەکە هەتـا بەرز و بلندبێ کەمە بە مەرجێك تێکەیشتنی تیابێ باکەمیش بێ وردە وردە لەکەل هاتنی ڕۆژانا هەموی تێ ئەکات یان مامۆستا و پەروەردە وان تێی ئەکەیەنن .

ئەنجامی ئەندیشەکە پێویستە پەندێکی تیـــا بێت ئەو پەندەیش هاندەر بێ بۆ پەروەردەی ڕاست .

هەلبەستی منال بەپێ ی ڕێباز (اسلوب) پێویستە وشەکانی سادە بێ ورستەکانی ڕەوان بێ ا تا منال بتوانێت لەبەری کات و بیلێ .

پێویستە کێشەکەی کورت و ئـاوازەدار بێ چونکە کێشەی درێژ ئەبێتە هۆی هەناسە سواربوونی منال ، ئەبێ هەر دێڕێك لە هەلبەستەکە لەنکەری تایبەتی خۆی جیا بێت .

وە تا لە توانـادا بێ ناوەڕۆك و مەبەستی هەلبەست بـە کەمترین دێڕ بدرێت بە دەستەوە .

ع . ع . شەونم
١٩٦٥ / ١٢ / ١٧

# چۆلـــەکە

جووك جووك چۆلـــەکە

چۆلـــەکە پچکۆلەکە



بـەلەرزە لـەرزى بالا

دیارە کەوتە سکالا

ئەلێ وەك تۆ منالـــم

زەرنەتووتـــەى ئەمسالم

خۆ تۆ خاوەنی هەستی
هەوڵ ئەدەی بۆ سەربەستی

بۆچی بەرد ئەهاوێژی ؟
خوێنی پاکم ئەڕێژی ؟

جووك جووك ئەی هاوار
دۆستم نیە سەر و خوار

بۆ سەر ئەڕوانم داڵە
خوارەوەشم مناڵە

جووك جووك داقی ئاش
بەکەو تەپنی دوو بەرداش

گیاندارێکی بێ هێزم
کەس ناڵێ ئەتپارێزم

## جۆلانـــه

جۆلانـــەی با جۆلانە
بۆ بالم بچکۆلانـــە
وەك بالنـدەی هێـــلانە
بفڕە ! بفڕە ! جۆلانە
بم بە ! بم بە ! بۆسەر دار
لەوێ سێو ئەخەمە خوار
بۆ نەخۆش و پـەریشان
بۆ هاوەل و بۆ خویشان
جۆلانـەکەم جۆلانـــە
بفڕە وەك ئـــەو مەلانە
بم بە ! بەرە و بەزرایی
لەوێ ئەیکەم بە شایی
وەك بالنـــدە ئەخوێنم
سەربـەسی خۆم ئەنوێنم

# کۆڵان

دایە ناچم بۆ کۆڵان
یاری ئەکەم لە داڵان
کۆڵان پیس و ناخۆشە
منال جنێو فرۆشە
بە خۆڕایی لێم ئەدەن
کەل و پەلیشم ئەبەن
دایکیشیان بە پێکەنین
پێیان ئەڵێن ئافەرین
کەی دایکن ئەوانە
تەمێ لایان تاوانە
منال ئەکەن بە چوختی
گۆشی ناکەن بە پوختی
دایك ئەبێ وەك تۆ بێ
تیشکی سەروی ئاسۆ بێ

ڕۆڵەی خۆت و نەناسراو
سەیریان ئەکەی بەیەك چاو

## بـــەبـــە

بەبە ! بەبە بچکۆلە
مەکری مەکری بەرخۆلە

بنوە لە نـاو جۆلانـــە
گـەرمو گوڕە هێلانـــە

دایـە دەستی گـــیراوە
منی لای تـــۆ دانـــاوە

منیش هەرچەن منالـــم
خەریکی ئیشی مـالم

هانێ مووروو ها خرخاڵ
ها بابـــەتی کڕ و کاڵ

بەبە ، پێ بکەنە ژیر بە
بەس چاوەڕوانی شیر بە



ئەم گریان و هاوارە
پیشەی کفت و بێکارە

کە کەورە بوی بەبە گیان
دادێ نابەخشێ گریان

ئەوسا دایــە و مەمزۆلە
خەوە خەوە بەرخۆلــە

## بووکەکەم

بووکەکەم ، بووکەکەم
بووکە ئێسک سووکەکەم

ئش . ئش . نایلۆنی بێهۆش
ئەی خۆشەویستی ڕووخۆش

پیلان ناکەی وەك زینو
نە برســیتە نە تینوو

من لە ئێستاوە دیــارە
خەمم هــەزار هەزارە

نــازانم هاوڕێی باشــم
چۆن و لــە چی داتاشـم

ئش ئش بالاكه ، بالا
تۆ هاوڕێمی لـه مالا



چۆنم ئەوێ وا ئەکەی
یەك یەك خەمم لا ئەبەی

هەردوو دەستم لە مل کە
کوێ بۆ لای‌لایەم شل کە

« ئش ئش ئەمرۆ بێکیانی
ئاکای دنیـــا نـازانی

رۆژێ ئەبێ کوزرپە کیان
کەورە ئەبم بۆ ژیان

ژیـان ئەبەخشم بـە تۆ
بۆ بـزوان و کفت و کـۆ

پەیکەر دڵپاك و جوانی
ئای داخە کەم بێکیانی »

## خواردن

بابە ! بابە دەست ئەشۆم
لە کەڵ ئیوە نـان ئەخۆم

لە بەر دەمی خۆمـــەوە
ئەخـۆم و ئەخۆمـــەوە

دەستم ڕاناوەشێنم
چێشتەکە نارژێنم



کەوچکەکەم پڕ ناکەم
سنگ و بەرۆک تەڕ ناکەم

کاتێ پارو ئەکلێنم
دوو لێوم ئەنووقێنم

پاروی پچوك قوت ئەدەم
ئینجـا پـاروی تر ئەکەم
هێمن و نەرم و نیان
بێ دەنگ ئەبم لەسەر نان
نەوەك پریشکی دەمم
بپرژێتــە بــەر دەمم
فرە فرو هەل لووشین
یا قرقێنە ، یا پژمین
تەقەی کەوچك و چنکاڵ
پەرداخ و قاپی بەتــاڵ
لە کەل هەلپـەی شێتـانە
ناشــیرنن ئەمــانە
کە چێشت هاتە کەمایی
دەس هەلئەگرم ئەسپایی
تێریش نەبم دام نــاوە
بـۆ خـۆم بکشێمە دواوە

بابــە شارەزای خوانم
کشت ویلێکی ئەزانم

## یــاری

لاچۆ لاچۆ دەی بـــڕۆ
یــاری ناکەم لە کەڵ تۆ

تۆ ئەڵێی شێت و هاری
نــازانی چۆنـــە یاری

دار ئەکێشی بـە سەرما
جـل ئەدڕێنی لـە بەرما

بە باز ئەچیتە سەر کۆڵ
فڕێ ئەدەی بەرد و خۆڵ

یا پاڵ ئەنێی لـە ناکاو
زامار ئەکەی دەم و چاو

وەکو من نیت بزیوی
فێری شەڕە جنێوی

هەتا وابی دەی بڕۆ
یاری ناکەم لە کەڵ تۆ

یاری دنیای بەهەشتە
یاری کەران فریشتە

## دەرگا

١ ـ تەق . تەق . کوێیە ڕێگایە
نا . نا . دەنگی دەرگایە
ئەوە کێیە ؟

٢ ـ منم من

١ ـ تۆ کێی دۆستی یا دوژمن ؟

٢ ـ میوانم دۆستی ئێوەم

بیکەرەوە چـاوەکەم

١ ـ بڕۆ کەس نیە لە مـال
پاسەوانێکم منال

٢ ـ بژی ڕۆڵەی کورچ و کۆل
پاسەوانی مالی چۆل

١ ـ خۆ بـابەیـە وەسـتاوە
دەنـگی لە من گۆڕاوە

دیـارە بابە لە پێشا
وریـایی منی کێشا

بابە بابـە بم بەخشە
فـەرمودەتـم لا نەخشە

دەرفەت نادەم بێگانە
فێر بن بەم دەرگاو بانە

## نیــاز

١ ـ ئەم پرسیارەم هاوڕێکانم
وەڵام وەڵام با بزانم
تۆ چیت ئەوێ ؟

٢ ـ خواردن و خەو

١ ـ تۆ چیت ئەوێ ؟

٣ ـ کۆتر و کەو .

١ ـ ئەی تۆ . . ئەی تۆ . .

٤ ـ جل و پــارە
یاری کردن تا ئێوارە

١ ـ هەهە . . هەهە . . پێکەنینە
خوازتەکان ناشیرینە

٢ . ٣ . ٤ : —

پێ مەکەنە ! پێ مەکەنە
ئەی خوازتی تۆ بایی چەنە

١ ـ من من ؟ نیازم تێکۆشانە
ڕەنجی بیرە ڕەنجی شانە

بۆ سەرکەوتن ، بۆ زانیاری
بۆ شێلانی نـاهەمواری

## مامـەی کۆڵان

مامەی کۆڵان داماوە
داماوی دەست و چاوە

سەیری کەن ڕووت و قووتە
لەم دنیایە نابووتـە

کەساسێکە بێچارە
مەینەتی لە سەر بـارە

ئەڕواو ئەسوڕێتـەوە
بۆ نان ئەپاڕێتـەوە

داستانی تۆماری
پڕە لە شەرمەزاری



نانی ئەوێ بۆژیان
ژیانی مان و نەمان
تو خوا بەردی تێ مەکرن
منال ڕێگەی پێ مەگرن

سزاو تالآوی ئێوەش
با نەبێتە باری لەش

مامەی لەرزۆك و بێ كەس
دڵسۆزێكی هەیە و بەس

ئەویش كێیە ئەزانن ؟
خاوەن بەزەیییەكانن

سایە و پەنای كەسانن
بەزەییە و دڵسووتانن

## باخچە

منالآنی ناوچە
با بچین بۆ باخچە

باخچە وەكو بەهەشتە
باوەشە بۆ فریشتە

باخچە باخی گوڵانە
جێی پەپولەی چڵانە

ئێمە فریشتەی شاخین
پەپولەی گوڵی باخین

لەوێ ئەنیشینەوە
پەروەردە ئەچنینەوە

دوایی ئەیکەین بە دیاری
بۆ لادێیی ، بۆ شاری

## ژمارە

یەك بابەمان ئیش کەرە
دوو دایکم چێشت لێنەرە

سێ خوشکم ئیشی زۆرە
چوار ئەو خوشکم جلشۆرە

پێنج خوشکی بچکۆلانە
وەڕ ویزرکەی هەموومانە

شەش کاکم تۆ و ئەچێنێ
حەوت ئەو کاکم ئەخوێنێ

هەشت نۆ دوو برام هەیە
یەکێکیان بچکۆلەیە

دە خۆمم خۆم ئەژمێرم
تا دە ژمارە فێرم

خێزانێکین دە سەر کەس
بەختیار و بە دەربەس

## تەنگانە

دەستە سڕم ئەهێنا
لە ماڵەوە بەجێ ما

خوایە چۆن لووتم بسڕم
وەختە یەخەی خۆم بدڕم



بیسڕم بـە داوێنـــا ؟
بە سـەر قۆلی خاوێنـا ؟

نا . ئەوە خۆی چەپەڵە .
پیشەی کێـل و تەمـەڵە

من کە ژێر و خاوێنم
چۆن شەرمی خۆم ئەشکێنم

چـار نیـە ئەبێ ئێستا
داوا کەم لـە مامۆسـتا

ڕێـم بـدا بڕۆمە دەر
ئەم داخە دەرکەم لە سەر

کەتێ ئەمـڕۆ تا مـاوم
کوم نابێ لە بەر چـاوم

کەل و پـەلی تەنکانـە
هەرزانیش بێ گرانـــە

# خوازتن

هاوڕێ کەل و پەل مەخوازە
بەسە داوای بێ ئەندازە
دەمێ ئەڵێیت پەڕەم بەرێ
دەمێ ئا تو خوا دادەرێ
دەمێ قوتابیەکەی پێشم
ڕاستەم بەرێ خەت ئەکێشم
هەتاکو کەی زمانی لووس
بۆ خەت کوژێن یا بۆ پێنوس
ئەڵێی ساوای دوو ساڵانی
یا کەنەفتی پەر ماڵانی
بێنە ا بێنە دەست پێ ئەکەی
وانەکەمان لێ تێك ئەدەی
منیش یەکێکم قوتابیم
دوکان و بازاڕی تۆ نیم

ڕۆژێ نیە دوو ڕۆژ نیە
خوێندن ئاوا بێ بۆ چیە ؟

ئەگەر قوتابیت بخوێنە
کەل و پەلی تەواو بێنە

هەر کەس چاوی لەم و لەوە
سەرکەردانی دنیای خەوە

## ڕێویە دزە

ڕێویە دزەی قوتابخانە
دەنگ و باسی ئەمڕۆمانە

ئەوا ئەمڕۆ پۆل بێدەنگ بوو
پێش ماوەی لێدانی زەنگ بوو

لە دواوە هاوارێ هەڵسا
پارەم دزرا ئای مامۆستا

قوتابیەکەی دەستی ڕاسی
دز بو ماموستا ئەی ناسی

پارەی دەرکرد لە گیرفانی
پارە خۆی بو ناو نیشانی

ئینجا وتی ئەم چاو بزە
ناوی ئەنێین ڕێویە دزە

ڕێویە دزە پاشی دزی
کەوتە گریان و سەر کزی

قوتابیەکان وەکو خورد
شوێنی کەوتن بە بالورە

ئەم چاو بزە ئەم چاو بزە
ناوی ئەنێین ڕێویە دزە

کەسێ دز بێ دیارە دیارە
شەرمەزارە شەرمەزارە

## یــادگار

کەل و پەلی پارم ماوە
لە ناو تاقێکا دام ناوە



پەڕاو ، تیانووس ، نمرەی سالم
ئەپارێــزم تــا منالم

هەڵیان ئـەگرم بۆ یادگار
هەتا ئەبم بە هەرزەکار

ئەوسا تەماشایان جوانە
وەك بـابـەتی مۆزەخـانە

ئەبن بە دیمەنی بەرچاو
هی پێشکەوتن هەنگاو هەنگاو

گەواتە هـەر لە ئێستاوە
بناغـەی پەنـدم دانـاوە

بۆ بـرا بچکۆلانەکەم
بۆ کەسـانی خێزانەکەم

دەر ئەکەوێ بێ تێکۆشان
کەس نای برێ پلەی ژیـان




# تەختەی ڕەش

ئەی تەختەی ڕەش تەختەی پۆلم
ئاودێــری سەوزایی گولــم

وەك ئاسمــانی شــەو ڕەشی
بــاوەشی ئەســتێرەی كەشی

له ئەستێرە نـــەزانی وێڵ
تەواوی ئەکا کەشتو کێڵ
منیش وێڵم تۆی ڕابـــەرم
تەختـــەی ڕەشی بەرامبەرم
نەزانێکم لـــەم دنیایـە
ئەستێرەم لـە ڕوی تۆدایە
ئەو ئەستێرەیش تەباشـــیرە
مرواری مامۆستای ژیـــرە
بۆم ئەبارێ وەکو تەرزە
نرخی یەك بە یەکی بـەرزە
تۆی کەردونی ئامۆژکاری
دنیای هونـــەر و زانیاری
بـــە ورشە ورشی سپیایی
بۆم ڕامالە تـاریکایی
تا تۆم هەبێ لەبـــەر چاوم
هـەرکیز نـاوەستێ هەنـکاوم

ئەڕۆم ئەڕۆم بەرەو ئاسۆ
تاكو ئەكەم بە ڕۆژی نۆ
ئەوسا بیرم وەك كشتو كاڵ
میوەی ئەخۆم گەورە و منال

## زەردەواڵە

وریا شاری زەردەواڵە
لەسەر دەرگای حەوشەی ماڵە
تا زوە ڕاكە لەو ناوە
شارەكەیان وروژاوە
ئالۆسكاون لە سەر چزن
پەلامار ئەدەن ئەكەزن
زەردەواڵە زیا نەخرۆن
تریی میوەكەمان ئەخۆن

بە ڕۆژیشا دێین و ئەچین

ئەبێ سەرمان دانەوێنین



وریا هەردوکمان بێزارین

تووشی یەك ئێش و ئازارین

مەلێ (1) سیرە گزشتم تالە

شەقێ بدە لەو منداڵە

---

(١) شعرێکی فۆلکۆری‌یە لە کاتی یاری‌کردنا ئەی‌ڵێن بۆ زەردەواڵە دەرکردن .

بە جوتە کەر هەوڵێ بدەین
زەردەواڵە لە ناو ئەبەین

جارێ بــا هێمن بنەوە
بۆ خۆیــان بنیشنەوە

لەسەر پلێ کۆشــق جکەر
کۆمـەڵ ئەبن بێ دەردی سـەر

ئەوسا هـەر بە یەك لووتی پێ
ئـەو کۆمـەڵە لە نـاو ئەچێ

سیرە سیرە سیرەی دوژمن
کە هەو داهات ئەخزێنە کون

شاپلیتەی بۆ هەڵ ئەکەین
تەختو تاراجی تێك ئەدەین (1)

---

( ١ ) بۆ لە ناو بردنی زەردەواڵە لە کۆنا شاپلیتەیان ئەکردو لەبەر دەمی کونە زەردەواڵەکەدا ژانەگیراو چیلکە ئەکرا بە کونـــەکەدا کە تەوروژان و ئەهـاتنـە دەرەوە بەر ئاگرەکە ئەکەوتن و ئەسووتان .

ئەوەی کە ما سەرمای زستان
ئەیان کوژێ لە ڕێگە و بان

جا وریا ئەوسا من و تۆ
سەربەست ئەبین لە هات و چۆ

## هەنگە بچکۆلە

هەنگە بچکۆلەکەم خۆش ئەوێ
چونکە تا ئەمرێ ناسرەوێ

خۆی بچوکە کیانی بەرزە
پەندێکە بۆ هەڵە و هەرزە

قسەی ناوێ لێی بێزارە
چرای باوەڕی کرداره

شان و بازووی بێ چرپە و دەنگ
ئەڕەتێنێ بۆ شاری هەنگ

هەنكە بچكۆلەم خۆش ئەوێ
دەم و دلی یەك ئەكەوێ

زارو دەروونی شیرینە
یا شانەیە یا هەنگوینە

هەرگیز نادا ئازاری كەس
كە پێوەدا خۆی ئەمرێ و بەس

ڕۆژ و شەو میوانی چلە
هاوڕێی ڕاستەقینەی گوڵە

كە دەم ئەخاتە دەمی گوڵ
هەر هەنگوینە تاسەی بە كوڵ

هەنكە بچكۆلەم خۆش ئەوێ
چونكە سوودی گشتی ئەوێ

تا لاشەی لە ناو خۆڵ و بەرد
دا ئەپۆشێ خەزانی زەرد

لە کام جێگا سەخت و دوورە
شەکراو ئەهێنێ بـۆ پوورە

هەرچەند منیش بـە دڵ و گیان
وەکو هەنگ ئەمرم بۆ ژیان

## دڵپاک

من وەك تۆ نیـم من دڵپاکم
من بێ ترسم من بێ باکم

دڵـی سـپی وەکو بەفـرم
ناهێڵـم ڕەش بێ تـا ئەمـرم

من ئـەزانـم بێت و ڕەش بێ
ئـەبێ جێگەی تۆڵـە و خـەش بێ

گوڵی کێوی لـە بەفرایـە
خـەڵووز هیچی لێ دەر نایـە

بەهاری دەروونم جوانە
وەکو ئاسۆی بەر بەیانە

پاك و بێگەرد پڕە لە گوڵ
پڕە لە گۆرانی سەر چڵ

ئیتر بۆچی بە کینەی خۆم
سەری ژیانی خۆم بخۆم

پێکەنینی خۆم خۆش ئەوێ
رق ناهێڵم توخنی کەوێ

کەچی تۆش پەست و لاوازی
وەکو مانوی سەر هەورازی

بۆیە ئاشتم کردیتەوە
هەتا وەك من ورد بیتەوە

پاکی هەست و دەروون و گیان
خەوی ئارامە بۆ ژیان

# گوڵی بەردەست

کولەکە کولەکەی ناو ئینچانە
پێیلەی سادەی ئەم هەیوانە



دوێنێ هاتم کەش بوی کول بوی
شۆخ و پاراوی سەر چڵ بوی

ئێستا ئەمە تۆی گوڵەکەی دوێنێ ؟
ئەو منداڵە ئەت پروێنێ ؟
ئەمە تۆی کەوتوی ئەمە تۆی سیسی ؟
یاری دەست و پەنجەی پیسی ؟
هەر خۆم زانیم گوڵەکەی بەر خۆر
دەوریان داوی منداڵی زۆر
زانیم لاوازی پێ دڕکی
شاباشی ئارامی ورکی
گوڵی نزمی بێ پاسەوان
ئەی ژاکێنێ دەسق تاوان

## گوڵی بەرز

ئەی گوڵی بەرزی ڕاسەری شەخەل
مایەی شانازی لارو لەنجەی تەل

بشنێ بەسەر باخ و چیمەنا
بڕوانە بەسەر جوانی دیمەنا



چونکە تا بەرزی پاك و بێگەردی
تا پاکی شادی بێ ئێش و دەردی

ئەنها هەر خۆتی پەری بەر بەیان
کاڵای سۆز ئەبڕی بە باڵای ژیان

ئاسمان بە ئاونگ بەیان بە شەماڵ
خەو ئەشۆنەوە لەسەر کۆنای ئاڵ

مەل دراوسێتە کە ئەجریوێنن
بە پاکی و بەرزی تۆدا ئەخوێنن

پەپولە ئەفڕێ بە سەمای پێدەنگ
وەك لەرەی خشڵەخشڵی ڕەنگاوڕەنگ

هەر لق و پۆپی پۆشتە و پەرداخە
پەرژینی باڵای فریشتەی باخـــە

کەواتە ئەی گوڵ گوڵی ئەم وەرزە
ژیـــانی پاکی کە ئـاوا بەرزە

دەستم دامێنت نەکەی دانـەوی
بەرەو نزمـایی بـەرەو سەرزەوی

چونکە نزمایی بۆ تۆ زیندانە
ئەو پەڕی جێکەی بەرزی گوڵدانە

گوڵدان مەزاری گوڵی بێ کیانە
گۆڕی سەر مێزی گۆڕەوانـــانە

چەنان چەپکە گوڵ بەسەران بە داوێ
بون بە قوربانی سەرنجی تـاوێ

پێ بکەنە ئەی گوڵ پێ بکەنە ئەی گوڵ
نەکەی دابەزی هەرکێز لەسەر چڵ

تا بەرزی پەریو فریشتەی بـاخی
تا نزمی لیتەی زەلکاوی شـاخی

# هەورە ڕەشە

کاکە . . کاکە . . بەری هەتاو گیراوە
هەورێکی زل لەبەر دەمیا وەستاوە

ئەها . . ئەها . . هەورە زلە بەش بەشە
لە پێشا زەردو سور بو ئێستا ڕەشە

تۆ سەیری کە هەورە ڕەشە چلکنە
جەرگی بە سپیایی هەتاو کون کونە

لە ئاسۆوە سەرنجم دا بە وێنە
زۆر جار گۆڕا تا گەیشتە ئەم شوێنە

دەمێ وەك شێری ئازا هاتە بەر چاو
دەمێ ڕێوی بێ کلکی لە کون خزاو

دەمێ توولەی وەفادار بو لە پاسا
دەمێ گوربەی سپڵە بو لە مەڵاسا

دەمێ کا بو دەمێ مەیموونی سەر دار
بۆ سەرشکانن کوێزی ئەخستە خوار

هەورە زلە سەرپۆشی دەستی بایە
لە هەر وێنەیەکا بێ ئاشکرایە

زۆری کرمان و چەخماخەی دا لە چاو
هەورە ڕەشە بۆی ئەگێرا خورەتاو

نەك من و تۆ کەس لە کرمەی ناترسێ
کەس لە ڕووناکی چەخماخەی ناپرسێ

ئەوا ئەڕوا سەر ئەکێشێ بە شاخا
ئەتوێتەوە ئەبێ بە ئاو لە داخا

کرمە کرم و سامی زلی بێ هونەر
هەورە هەورە ئەرمە با ئەیداتە بەر

# جــل

چــاوم كێرا ورد و درشت
جلی ساده و پاکه سروشت

له سالێکا تەنها یەك جـار
جـل ئەكۆرێ بـاخی بەهــار

بەلاّم ئەی شۆرێ پاك و جوان
بە ئاونـگی دەمــەو بەیان

كــه كون ئەبێ کەلای سێبـەر
ئینجا پایــز ئەیکاتە بــەر

تــا ئەوەرێ تــا ئـەدرێ
بارانی پەلــه ئــەی سرێ

چــاوم كێرا ورد و درشـت
بـەرگی ساده و پاکە سروشت

جلی باڵنـدە جلی پـەڕ
بە هاوین و زستانی تـەڕ

دەستێکە بەڵام خاوێنـە
بێ گەردە وەکو ئاوێنە

کارە کۆرپـەی داوێنی ڕەز
جوانـە لە نـاو توکی مەرەز

منیش جلی سادەم ئـەوێ
ئاهێنلم گەردی بەرکەوێ

جل نابێ قەوزەی پەنگاو بێ
سەوز و جوانی بەر هەتـاو بێ

جوانیە کەی هەر دیوی دەر بێ
نـاوی چڕ و جانـەوەر بێ

بەرگی سادە و پاکی سروشت
مژدێـلە بۆ ورد و درشـت

# ناوەرۆک